زَكَاةَ الْفِطْرِ : بریتیە لە خێرێک کە لە کۆتایی مانگی ڕەمەزان دەردەکرێت لە ماڵەکەی واجبە پێش دەرچوون بۆ کاتی نوێژی جەژن ئەم زەکاتە بدرێت

حوکمەکەی : واجب و فەرزە بەو مەرجەی لە زیادەی قوتی خۆی و هاوسەر و منداڵەکانی هەبێت ئینجا بیدات ملزم دەبێت بە دانی زەکاتی فطر بەسەر خۆی و ئەو کەسانەی نەفەقەیان دەکات

زَكاةُ الفِطْرِ مِن العِباداتِ الَّتي مَنَّ اللهُ سُبحانَه وتعالَى بها علَينا؛ وجعَلَها طُهرةً وكفَّارةً لِما قد يقَعُ للصَّائمِ مِن نُقصانِ الأجْرِ في شَهْرِ رَمَضانَ، وطُعْمةً للمساكينِ مِن المسلمينَ

زەکاتی فیتر : لەو عیباداتانەیە کە الله تعالی منەتی بەسەرماندا کردووە و دەیگێڕێت بە پاک بوونەوە و کەفارەتی ئەو ڕۆژووانەی کە کەمتەرخەمی و تاوانمان تێیدا ئەنجامداوە بۆتە هۆکاری کەم کردنەوەی پاداشت لە مانگی ڕەمەزاندا وە خواردنێکیشە بۆ هەژاران لە موسڵمانان

1 - عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ : فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى الْعَبْدِ وَالْحُرِّ، وَالذَّكَرِ وَالأُنْثَى، وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ، وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ . (صحيح البخاري :١٥٠٣صحيح مسلم:٩٨٤)

**ڕاڤەی ئەم فەرموودە :**

ابن عمر دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم زەكاتى سەر فیترەی فەڕزکرد بە :

ڕێژەی زەکاتەکە :

صَاعًا : وشەی (صَاعً) واتە : مكيال وەک النسائي و مالك باب یێکیان داناوە بەناوی ( **مَكِيلَةُ زَكَاةِ الْفِطْرِ** ) بریتیە لەو ئامێرەی کە گەنم و جۆی پێ دەکێشرێت نزیکەی چوار مشت دەبێت بە موشتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم کە دەکاتە دوو کیلۆ و شەسەت گیرام (2 . 6 کجم)

2 - عَنْ نَافِعٍ ، قَالَ : كَانَ ابْنُ عُمَرَ يُعْطِي زَكَاةَرَمَضَانَ بِمُدِّ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ الْمُدِّ الأَوَّلِ وَفِي كَفَّارَةِ الْيَمِينِ بِمُدِّ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ. (صحيح البخاري :٦٧١٢)

نافع دەڵێ : ابن عمر زەکاتی فیتری ڕەمەزانی دەدا بە موشتی یەکەمی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم وە لە کەفارەتی سوێندیش بە موشتی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم دراوە .

**سوود** : (وَفِي كَفَّارَةِ الْيَمِينِ بِمُدِّ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ) لە کەفارەتی سوێندیشدا نابێت بە پارە بیدەیت دەبێت خواردن بێت .

## زەكاتە لەچی ئەكەوێت :

صَاعًا مِنْ تمْرٍ : دوو كیلۆ و شەسەت گیرام (2 . 6 كجم) لە خورما

أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ :دوو كیلۆ و شەسەت گیرام (2 . 6 كجم) لە جۆ

أَوْ صَاعًا مِنْ أَقِطٍ :دوو كیلۆ و شەسەت گیرام (2 . 6 كجم) لە شیری وشک . (صحيح البخاري:١٥٠٦)

أَبَا سَعِيدٍ الْخُدْرِيَّ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، يَقُولُ : كُنَّا نُخْرِجُ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ طَعَامٍ : دوو كیلۆ و شەسەت گیرام (2 . 6 كجم) لە گەنم. (صحيح البخاري:١٥٠٦)

أَوْ صَاعًا مِنْ زَبِيبٍ : دوو كیلۆ و شەسەت گیرام (2 . 6 كجم) لە مێوژ . (صحيح البخاري:١٥٠٦)

أَوْ نِصْفُ صَاعٍ مِنْ قَمْحٍ : یان نیو صاع لە گەنم . (مسند احمد:٧٧٢٤)

قَالَ عَبْدُ اللَّهِ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ : فَجَعَلَ النَّاسُ عِدْلَهُ مُدَّيْنِ مِنْ حِنْطَةٍ

عبداللە ی عومەر دەڵێ : خەڵكانێک نیوەی صاع ێک لە گەنمیان زەكات دەدا.

(صحيح البخاري:١٥٠٧ صحيح مسلم:٩٨٤)

فَجَعَلَ النَّاسُ : مەبەستی ئیمامی معاویة و شوێن کەوتوانی بوو .

**لێدوان** : زەکاتی سەر فیترە دەبێت لە خواردن بێت نابێت قیمەتی بە پارە بدرێت بابەتەکە بابەتێکی پەرستشە نابێت پێچەوانەی تێدا بکرێت لەسەردەمی پێغەمبەریش صلی الله علیه وسلم دینار و درهەم هەبووە بەڵام بە خواردن فەڕزی کردووە ئەگەر بە پارە بدرێت ئەوە بەتاڵە . وە خواردنەکەش دەبێت لە خواردنی شارەکە بێت ئەو خواردنەی زۆرترین کات دەخورێت نمونەش لە خواردنی شاری ئێمە (برنج)ە کە تێیدا  دەبێت هەر سەرۆک خێزانێک دوو کیلۆ و شەسەت گیرام (2 . 6 کجم) برنج بدات

## زەکاتەکە چ کاتێک دەبێت بدرێت ؟

وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلَاةِ : وە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی کرد کە ئەم زەکاتە پێش دەرچوونی خەڵک بیدات بۆ نوێژی جەژنی ڕەمەزان تەبعەن پێش و پاشی ئەو وەختە درووست نیە و زەکاتەکە ناکەوێت .

**عَنِ ابْنِ عَبَّاسٍ قَالَ : فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَكَاةَ الْفِطْرِ طُهْرَةً لِلصَّائِمِ مِنَ اللَّغْوِ وَالرَّفَثِ وَطُعْمَةً لِلْمَسَاكِينِ، مَنْ أَدَّاهَا قَبْلَ الصَّلَاةِ فَهِيَ زَكَاةٌ مَقْبُولَةٌ، وَمَنْ أَدَّاهَا بَعْدَ الصَّلَاةِ فَهِيَ صَدَقَةٌ مِنَ الصَّدَقَاتِ .** (سنن أبي داود:١٦٠٩)

ابن عباس دەڵێ : پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم زەکاتی سەر فیترەی فەڕزکرد بۆ پاک کردنەوەی ڕۆژووان لە قسەی پڕ و پوچ و جیماع لەگەڵ هاوسەران وەک خواردنێک بۆ هەژاران هەرکەسێک پێش نوێژی جەژن بیدات ئەوە قبوڵە وە هەرکەسێک دوای نوێژی جەژن بدات ئەوە دەبێتە خێرێک لە خێرەکان لە زەکاتەکە ناکەوێت

**قال أبي داود :فَكَانَ ابْنُ عُمَرَ يُؤَدِّيهَا قَبْلَ ذَلِكَ بِالْيَوْمِ وَالْيَوْمَيْنِ .** (سنن أبي داود : ١٦١٠)

ابي داود دەڵێ : ابن عمر زەکاتی سەر فیترەی دەدا پێش نوێژی جەژن بە ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ

عَنْ نَافِعٍ : أَنَّ عَبْدَ اللَّهِ بْنَ عُمَرَ كَانَ يَبْعَثُ بِزَكَاةِ الْفِطْرِ إِلَى الَّذِي تُجْمَعُ عِنْدَهُ قَبْلَ الْفِطْرِ بِيَوْمَيْنِ أَوْ ثَلَاثَةٍ . (موطأ:٧٧٩)

نافع دەڵێ : عبداللەی کوڕی عمر ئەو کەسەی زەکاتی کۆدەکردەوە دەینارد بۆ کۆکردنەوەی زەکاتی فیتر پێش نوێژی جەژن بە دوو ڕۆژ یاخود سێ ڕۆژ .

عَنْ مَالِكٍ : أَنَّهُ رَأَى أَهْلَ الْعِلْمِ يَسْتَحِبُّونَ أَنْ يُخْرِجُوا زَكَاةَ الْفِطْرِ إِذَا طَلَعَ الْفَجْرُ مِنْ يَوْمِ الْفِطْرِ قَبْلَ أَنْ يَغْدُوا إِلَى الْمُصَلَّى . (موطأ:٧٧٩)

مالیک دەڵێ : ئەهلی علم وای دەبینم بەخێریان زانیوە زەکاتی سەر فیترە دەربکەن ئەگەر بێت ڕۆژ هەڵبێت لە ڕۆژی جەژنی ڕەمەزان پێش دەرچوونت بۆ مزگەوت بۆ کردنی نوێژەکە .

الزهري دەڵێ : کێشەی تێدانیە ئەگەر بێتوو زەکاتی فیتر بدەیت ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ پێش نوێژی جەژن وە یان ڕۆژێک یان دوو ڕۆژ لە پاش جەژن . (المصنف لعبدالرزاق:٥٨٤١)

ابن جريج دەڵێ : وتم بە عطاء ئایە کێشەی تێدایە دوای نوێژی جەژن زەکاتی سەرفیترە بدەم ؟ وتی : نەخێر . (المصنف لعبدالرزاق:٥٨٤٢)

الحکم دەڵێ : سەلەف بەخێرتری زانیوە پێش نوێژی جەژن بدرێت عامر دەڵێ : ویستت پەلەبکەیت لە دەرکردنی یاخود تاخیری بکەیت . (المصنف لابن أبي شيبة:١٠٣٣)

ابن عون دەڵێ : ابن سيرين فێری دەکردن کە خێری سەر فیترە دوای نوێژی جەژن بدەن.

(المصنف لابن أبي شيبة:١٠٣٤)

ابو اسحاق دەڵێ : أبو ميسرة دوای نوێژکردن خواردنی دەدا .

(المصنف لابن أبي شيبة:١٠٣٥)

ئیمام احمد دەڵێ : دوای نوێژیش کێشەی تێدانیە . (الفروع ٢ / ٥٣٣)

## زەكاتی سەر فیترە لەسەر كێ واجبە ؟

عَلَى الْعَبْدِ : بەندە

وَالْحُرِّ : ئازاد

وَالذَّكَرِ : نێر

وَالْأُنْثَى : مێ

وَالصَّغِيرِ : بچوک

وَالْكَبِيرِ : گەورە

فَقِيرٍ أَوْ غَنِيٍّ : هەژار یان دەولەمەند

(مسند احمد٧٧٢٤)

مِنَ الْمُسْلِمِينَ : لە موسڵمانان واتە لە کافر دەرناکرێت

عَنْ مَالِك : أَنَّ أَحْسَنَ مَا سَمِعَ فِيمَا يَجِبُ عَلَى الرَّجُلِ مِنْ زَكَاةِ الْفِطْرِ : أَنَّ الرَّجُلَ يُؤَدِّي ذَلِكَ عَنْ كُلِّ مَنْ يَضْمَنُ نَفَقَتَهُ، وَلَا بُدَّ لَهُ مِنْ أَنْ يُنْفِقَ عَلَيْهِ، وَالرَّجُلُ يُؤَدِّي عَنْ مُكَاتَبِهِ وَمُدَبَّرِهِ وَرَقِيقِهِ كُلِّهِمْ غَائِبِهِمْ وَشَاهِدِهِمْ ؛ مَنْ كَانَ مِنْهُمْ مُسْلِمًا، وَمَنْ كَانَ مِنْهُمْ لِتِجَارَةٍ أَوْ لِغَيْرِ تِجَارَةٍ، وَمَنْ لَمْ يَكُنْ مِنْهُمْ مُسْلِمًا، فَلَا زَكَاةَ عَلَيْهِ فِيهِ . (موطأ : ٧٧٢)

مالیک دەڵێ : باشترین لەوەی گوێمان لێبووە ئەوەیە کە زەکاتی فیتر واجبە لەسەر پیاوێک لەجیاتی هەموو ئەو کەسانەی لەژێر نەفەقەی ئەون وە ئەو کەسانەی کە پێویستە کە نەفەقەیان بدەیت پیاوێک دەبێت زەکاتی سەرفیتر بدات لەجیاتی هەموو بەندە و کەنیزەکەکانی ئەوەی لێی نادیارە و ئەوەشی لێی دیارە بەومەرجەی موسڵمان بن ئەوەشی بۆ بازرگانی بێت یاخود بۆ بازرگانی نەبێت بەڵام ئەگەر موسڵمانی تێدا نەبوو ئەوە زەکاتی لەسەر نیە .

## زەكاتى سەر فيترە بە پارە بەتاڵ دەبێتەوە ؟

قَالَ أَبُو سَعِيدٍ : لَا أَزَالُ أُخْرِجُهُ كَمَا كُنْتُ أُخْرِجُهُ عَلَى عَهْدِ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ أَبَدًا مَا عِشْتُ . (صحيح مسلم:٩٨٥)

باوكى سعيد دەڵێ : بەردەوام زەكاتمان دەركردووە (لەخواردن) وەک چۆن ئێمە لەسەردەمى پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم بەردەوام (بەخواردن)دەرمان دەكرد بۆ هەتايە تا ئەو ژيا .

أبي داود دەڵێ : گوێم لە احمد بوو پرسيارى لێكرا ئايە زەكاتى سەرفيترە لە نان دەدرێت ؟ وتى : نەخێر وتيان : ئەى ئەگەر بە درهەم بدەين ؟ لە وەڵامدا وتى : دەترسێم درووست نەبێت چونكە پێچەوانەى سوننەتى پێغەمبەرە صلى الله عليه وسلم . (مسائل أبي داود:١٢٣)

عبدالله بن الإمام احمد دەڵێ : گوێم لە باوكم بوو پێى درووست نەبوو زەكاتى سەر فيترە بە قيمەت پارە بدرێت دەى وت : دەترسێم زەكاتەكە بە پارە لەماڵەكەت نەكەوێت . (مسائل عبدالله :٦٤٧)

صالح دەڵێ : وتم بە باوكم خەڵكانێک دەڵێن خواردن بە سوودترە بۆ هەژاران وە خەڵكانێكى تر دەڵێن نان باشترە باوكم بە ناپەسەندى زانى و وتى : سوونەت لە شوێنى خۆيدا دابنێن الله تعالى دەفەرمووێت(فَإِطْعَامُ سِتِّينَ مِسْكِينًا) نە فەرمانى قيمەتى پێ كردووين نە هيچى تر ئەوە دەدەين كە فەرمانى پێ كردووين كە خواردنە وە فەرموودەى ابن عمر (فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ أَوْ صَاعًا مِنْ شَعِيرٍ عَلَى الْعَبْدِ وَالْحُرِّ، وَالذَّكَرِ وَالْأُنْثَى، وَالصَّغِيرِ وَالْكَبِيرِ مِنَ الْمُسْلِمِينَ،

وَأَمَرَ بِهَا أَنْ تُؤَدَّى قَبْلَ خُرُوجِ النَّاسِ إِلَى الصَّلاَةِ) زەكات لەو خواردنە دەردەكەين كە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرمانی پێكردووین بیدەین ناچین بۆلای ابن عمر یان ابی سعید (مسائل صالح :١٢٣٦)

ئیمام احمد دەڵێ : درووست نیە زەكاتی سەرفیترە بە قیمەت بدرێت پێی وترا : دەڵێن عمر بن عبدالعزیز قیمەتی داوە ؟ ئیمام وتی : من دەڵێم پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم بەخواردن داویەتی نەوەک قیمەت ئیوەش دەڵێن فلان كەس بە قیمەت داویە ؟ (عَنِ ابْنِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، قَالَ : فَرَضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ زَكَاةَ الْفِطْرِ صَاعًا مِنْ تَمْرٍ ..) وە الله دەفەرمووێت (قُلْ أَطِيعُوا اللَّهَ وَالرَّسُولَ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَإِنَّ اللَّهَ لَا يُحِبُّ الْكَافِرِينَ) ئێوەش دەڵێن : فلان و فلان وادەكات و وا دەڵێت؟ (المغني ٢ / ٣٥٢)

ئیمامی شافعی دەڵێ : درووست نیە زەكاتی سەر فیترە بە قیمەت بدرێت . (الأم ٢/ ٧٢)

ئیمامی مالیک دەڵێ : درووست نیە بۆ پیاو لە زەكاتی سەر فیترە لەجێگای خواردن قیمەت دانێت ئەوە فەرمانی پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم نەبووە . (المدونة ٢ / ٣٨٥)

ابن المنذر دەڵێ : بە ئیجماع درووست نیە لەجیاتی خواردن قیمەت بدەیت .
(الإقناع في مسائل الإجماع:١٨٤)

ابن قدامة دەڵێ : زەكاتی سەر فیترە بە قیمەت درووست نیە چوونكە لادانە لە دەقەكان وە دەڵێ : هەركەسێک قیمەت بدات زەكاتەكەی درووست نیە . (الكافي ١ / ٤١٦ المغني : ١٩٦٦)

**تمت بحمدالله**

براتان

هاوکار کوردی

ڕۆژی شەممە پازدەی ڕەمەزانی ساڵی ١٤٤٣ کۆچی

بەرامبەر بە

شازدەی ئەبریل ـی ساڵی ٢٠٢٢ ـی میلادی

وەڵاتی یۆنان